ڕێکخراوی گەشەپێدانی قوتابیانی کوردستان




پڕۆژەی نوری جیهان




# گەوهەری بوخاری رحمه الله




ئامادەکردنی

سیروان کاکە أحمد

پێداچوونەوەی

صلاح الدین أحمد

تـێـبـیـنـی:
هەر بەڕێزێك ئەم PDF بەكاردەهێنت بۆ تاقیكردنەوەكە، پێویستە لە ڕێگەی نامەیەكەوە نـاوی خـۆی تۆمـار بكـات، ئـەگینا بـە بەشـداربوو حسـاب ناكرێـت. ( نـاوی سـیانی و شـوێن و ئاستی خوێندن) بنێرە بۆ 07507389118 (ڤایبەر یان وەتس ئاپ)

١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:
«الإِيمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَلِقَائِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ كُلِّهِ».
ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
ئیمان بریتیە لەوەی بڕوابێنی بە خواو، بە فریشتەكانی و، كتێبەكانی و، پێغەمبەرەكانی و، پێگەیشـتنی و، ئـیمان بێنی بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی.

٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ».
ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بێگومان خوا نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەیە، سەد جگە لە یەكێك، هەر كەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت.

٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا، مَنْ خَلَقَ كَذَا، حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ وَلْيَنْتَهِ».
واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
شەیتان دێت بۆ لای یەكێكتان و پێی دەڵێ: كێ ئەوەی دروستكردوە؟ كێ ئەوەی دروسـتكردوە؟ هەتـا دەڵـێ: كێ پەروەردگاری دروستكردووە؟ ئەگەر گەیشتە ئەوە، جا با پەنا بە خوا بگرێ و وازی لێ بێنـێ (لەگەڵـی پێـدا نەچێ و واز لەو بیركردنەوە بێنێ).

٤ . «قَالَ اللَّهُ ﷻ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ».
واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
خوا ﷺ دەفەرموێ: نەوەی ئادەم (مرۆڤ) جنێوو قسەی ناشرین بە ڕۆژگار دەدات، من ڕۆژگـارم، ڕۆژگـاریش بە دەستی منە، شەوو ڕۆژ هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكەم.

٥ . «إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلَّا غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا»
واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
ئـایین (ئیسـلام) ئاسـانە، هەر كەسـێكیش بیەوێـت ئـایین (ئیسـلام) لەسـەر خـۆی قـورس بكـات و بەقورسـی وەریبگرێت ئیللا ئایین بەسەریدا زاڵ دەبێت و پەكی دەخـات، بـۆیە هەمیشـە هەوڵبـدەن ڕاسـتەڕێ بگـرن و ڕاستی بپێكن هەمـوو شـتەكان وەک خـۆی ئەنجـام بـدەن، خـۆ ئەگەر هەر نەتـانتوانی بەتەواوی بپـێكن ئەوە هەوڵبدەن نزیک ببنەوە لێی، وە هەمیشەش مژدەدەربن مژدە بدەن.

٦ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ».

**واته:** ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
سێ شت لە هەر کەسێکدا هەبن ئەو کەسە شیرینی ئیمانی چێشتوە، کە خواو پێغەمبەری خوای لە غەیری خۆیان خۆشتر بوێ، هەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێ، پێشی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ ناو کوفرو خراپە، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگر.

٧ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نییە، هەتا ئەو کاتەی کە منی لە باوك و دایك و منداڵەکانی و هەموو خەڵك خۆشتر دەوێ.

٨ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَنْ يَأْبَى؟ قَالَ: «مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
هەموو ئوممەتی من دەچنە بەهەشت مەگەر کەسێك پشت هەڵبکات، گوتیان: کێ پشت هەڵدەکات ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هەر کەسێك فەرمانبەریی من بکات دەچێتە بەهەشتەوە، هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی من بکات بێگومان پشتی هەڵکردوە (لە چوونە بەهەشت).

٩ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا  فەرموویەتی:
هەر کەسێك فەرمانبەریی من بکات ئەوە فەرمانبەریی خوای کردووە، هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرمانی من بکات ئەوە سەرپێچی خوای کردوە.

١٠ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«إِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
ئەگەر شتێکم لێ قەدەغە کردن لێی دووربکەونەوە، ئەگەر فەرمانیشم پێکردن بە کارێك، ئەوەندەی کە لە تواناتاندایە ئەنجامی بدەن.

١١ . عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:
«لاَ تَزَالُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ»

واته: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بەردەوام خەڵکێک لە ئوممەتەکەم دەستگرن بە ئایینی خوا، هەتا فەرمانی خوایان بۆ دێ بە سەرکەوتن، هەر پابەندن بە دینداریی.

١٢ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ ﷺ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاَثًا، حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ».

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك فەرمایشتی بفەرمووایە، سێ جار دووبارەی دەکردەوە، هەتا خەڵک لێی تێبگەن.

١٣ . عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ:
«مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ، إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ».

واته: عائیشە ﷺ دەڵێ: هیچ کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك نەکراوە لە نێوان دوو شتدا هەمیشە ئەوەی هەڵبژاردووە کە ئاسان بووە، مادام گوناح نەبووبێ، ئەگەر گوناهیش بووبێ، ئەوە لە هەموو خەڵکی لێی دوورتر بووە.

١٤ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا، وَلاَ تُنَفِّرُوا».

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
موژدەدەربن (بۆ خەڵکی)و دووریان مەخەنەوە (لە ئایین)، وە ئاسانکاربن، سەختگیری و قورسی مەکەن.

١٥ . عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الأَيَّامِ، كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا»

واته: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ:
پێغەمبەر ﷺ ماوە ماوە ئامۆژگاری دەکردین، بۆ ئەوەی تووشی بێزاری و بێ تاقەتی نەبین (واته: کارەکان زۆربن و بۆمان جێبەجێ نەکرێن).

١٦ . عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِعَلِيِّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ:
«فَوَاللَّهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلًا وَاحِدًا، خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ»

واته: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی ﷺ فەرموو:
سوێند بە خوا ئەگەر بە هۆی تۆوە خوا یەک کەس هیدایەت بدات، بۆت باشترە لەوەی کە حوشترێکی سوورت هەبێ.

١٧ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ».

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بڕوادار لە یەک کونەوە دووجار ناگەسترێ، (واته: دووجار بە یەک شێوە فێڵی لێ ناکرێ).

١٨ . عَنْ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:

«إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ: فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا».

**واته:** مالیكی كوڕی حوره‌یث ﵁ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر كاتی نوێژ هات: با یه‌كێكتان بانگ بدات، پاشان كامه‌تان گه‌وره‌تره با پێشنوێژیتان بۆ بكات.

١٩ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا»

**واته:** ئه‌بو هوره‌یره‌ ﵁ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی:
ئه‌گه‌ر خه‌ڵك ده‌یانزانی چ پاداشتێك له‌ بانگدان و ڕاوه‌ستان له‌ ڕیزی یه‌كه‌می نوێژی به‌ كۆمه‌ڵ هه‌یه‌و، پاشان هیچیان ده‌ست نه‌كه‌وتبا، جگه‌ له‌ تیروپشك، ئه‌وه‌ تیروپشكیان بۆ ده‌كرد (تاكو كامیان بانگ بدات و كامیان بچێته‌ ڕیزی پێشه‌وه‌).

٢٠ . عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا»

**واته:** عائیشه‌ ﵂ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی:
بێگومان ئیمام ته‌نیا بۆ ئه‌وه‌ دانراوه‌ په‌یڕه‌وی بكرێ، جا ئه‌گه‌ر چووه‌ ڕكووع، ئێوه‌ش ڕكووع ببه‌ن، ئه‌گه‌ر هه‌ڵساوه‌ هه‌ڵسنه‌وه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر به‌ دانیشتن نوێژی كرد، ئێوه‌ش به‌ دانیشتنه‌وه‌ نوێژ بكه‌ن.

٢١ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«لَيْسَ صَلَاةٌ أَثْقَلَ عَلَى المُنَافِقِينَ مِنَ الفَجْرِ وَالعِشَاءِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»

**واته:** ئه‌بو هوره‌یره‌ ﵁ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی:
هیچ نوێژێك، وه‌ك نوێژی به‌یانی و عیشا قورس نیه‌ له‌سه‌ر دووڕووه‌كان، ئه‌گه‌ر ده‌یانزانی چ پاداشتێك له‌ نوێژی (به‌ كۆمه‌ڵ) كردنیاندا هه‌یه‌ به‌ گاگۆڵه‌ش بووایه‌ بۆی ده‌هاتن.

٢٢ . عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَمَنْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ خَلْفَهُ الضَّعِيفَ وَالكَبِيرَ وَذَا الحَاجَةِ».

**واته:** ئه‌بو مه‌سعوودی به‌دریی ﵁ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی:
ئه‌ی خه‌ڵكینه‌، كه‌سانێكتان تێدایه‌ خه‌ڵك دووره‌خاته‌وه‌ (له‌ نوێژ)، هه‌ر كه‌س پێشنوێژی كرد بۆ خه‌ڵك، با كورتی بكاته‌وه‌ (به‌ ڕه‌چاوكردنی ته‌واوی ڕوكن و سوننه‌ته‌كان)، چونكه‌ له‌ دوایه‌وه‌ كه‌سانی بێهێزو به‌ ته‌مه‌ن و خاوه‌ن پێداویستی تایبه‌ت هه‌ن.

٢٣ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ أَكَلَ نَاسِيًا، وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێکی خوارد لە بیری چوو بەرۆژووە، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، چونکە ئەوە خوا ئەو خواردن و خواردنەوەیەی پێداوە.

٢٤ . عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، بَعَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا»

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
هەر کەسێک یەک ڕۆژ بەڕۆژوو بێ بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا، خوا حەفتا پایز ڕووخساری لە ئاگری دۆزەخ دووردەخاتەوە.

٢٥ . عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ».

**واتە:** عەمری کوڕی عاص ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
ئەگەر دادوەرێک دادوەریی کردو کۆششی- تێداکردو (خۆی ماندووکرد ئنجا بڕیاریدا)، پاشان پێکای (لە بڕیارەکەیدا) ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر دادوەری کردو کۆششی تێداکردو پاشان هەڵەی کرد (نەیپێکا لە بڕیارەکەیدا)، ئەوە تەنها یەک پاداشتی هەیە (پاداشتی خۆماندوو کردن و کۆششەکەی).

٢٦ . عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ».

**واتە:** ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ هیچ کەس دادوەری لە نێوان دوو کەس بکات لە کاتێکدا تووڕەیە.

٢٧ . عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ: الأَلَدُّ الخَصِمُ».

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بێگومان بوغزێنراوترینی پیاوان لە لای خوا: (کەسێکە) زۆر شەڕەقسەو کێشە دروست دەکات.

٢٨ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبًا، لِيَقْتَطِعَ مَالَ أَخِيهِ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ».

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
هەر کەسێک بە درۆ سوێند بخوات، بۆ ئەوەی ماڵی براکەی بۆ خۆی ببات، کە بە خوا دەگاتەوە، تووڕەیی خوای لەسەرە.

٢٩ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:
«الكَبَائِرُ: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَاليَمِينُ الغَمُوسُ».
واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﵁دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
گوناهی گەورە بریتیە لە: هاوبەشدانان بۆ خوا، ئەزیەتدانی دایک و باوک، کوشتنی مرۆڤ (بە ناهەق)، سوێند خواردن بە ناوی خوا بە درۆ.

٣٠ . عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».
واته: عوسمان کوڕی عەففان ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
باشترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات.

٣١ . عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ، وَهُوَ حَافِظٌ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الكِرَامِ البَرَرَةِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ، وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ، فَلَهُ أَجْرَانِ»
واته: دایکمان عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
وێنەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و لەبەریەتی لەگەڵ فریشتە چاکەکارە ڕێزدارەکانی خوان، وێنەی ئەو کەسەش کە قورئان دەخوێنێ، لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاك نایزانێ) و لەسەری قورسە، ئەوە دوو پاداشتی هەیە.

٣٢ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ»
١٨٠- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
واته: مسوڵمان برای مسوڵمانە، نە ستەمی لێ دەکات و نە ڕێگەی دەدات بچێ ستەم بکات.

٣٣ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ
«اتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ»
واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
خۆتان بپارێزن لە دوعای ستەم لێکراو، چونکە هیچ پەردەیەک نیە لە نێوان پاڕانەوەکەیی و خوادا (واتە: دوعاکەی وەرگیراوە).

٣٤ . عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:«إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ»
واته: ئەبو مووسای ئەشعەریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بێگومان خوا ماوە دەدات بە ستەمکار هەتا کاتێک دەیگرێ، جا کە گرتی بەری نادات.

٣٥ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تُطْعِمْهَا، وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ»

**واته:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

ژنێک خرایە ئاگرەوە بە هۆی ستەمکردنی لە پشیلەیەک، بەستوویەوە، نە خواردنی پێدەدا، نە ڕێگەی دەدا بچێ لە خاشاک و زیندەوەری زەوی بخوات (تا مرداربۆوە).

٣٦ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:«لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ».

**واته:** ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ براو (خوشکی مسوڵمانیشـی) پێی خۆش دەبێ.

٣٧ . عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«إِنَّ المُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا» وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ.

**واته:** ئەبو مووسای ئەشعەریی ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

بێگومان بڕوادار بۆ بڕوادار وەك خشت و دیواری بینـا (خـانوو)ە، هەنـدێکی هەنـدێکی توونـدو پـتەو دەکەن، (ڕاوی دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتەکانی دەفەرموون)، پەنجەی دەستەکانی خستنە نێو یەکتری.

٣٨ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«حَقُّ المُسْلِمِ عَلَى المُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَعِيَادَةُ المَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ العَاطِسِ».

**واته:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان پێنجن: وەڵامدانەوەی سڵاو، سەردانی نەخۆش، شوێنکەوتنی تەرمـی مـردوو، بە دەم بانگهێشتەوە چوون، دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمی (ئەگەر گوتی: الحمدلله).

٣٩ . عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَرَى المُؤْمِنِينَ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، كَمَثَلِ الجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا، تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالحُمَّى».

**واته:** نوعمانی کوڕی بەشیر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

ئیمانداران دەبینی لە یەکـتر خۆشویسـتن و بەزەیـی بە یەکـتردا هـاتنەوەو پەرۆشـیان بـۆ یەکـتر وەك وێـنەی یەك جەستەن، کە ئەگەر ئەندامێکی ناساغ بوو، هەموو جەستەکە بە شەونخونی و تاوە بەشداری دەکات.

٤٠ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً، فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ».

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
هەر کەسێک لە دابینکردنی پێداویستی براکەی بێ، خوا لە جێبەجێکردنی پێداویستی ئەوە، هەر کەسێک ناخۆشییەک لاببات لەسەر مسوڵمانێک، خوا ناخۆشیەک لە ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبات، هەر کەسێک کەموکوڕی مسوڵمانێک داپۆشێ، خوا لە ڕۆژی دوایی (عەیبەکانی) دادەپۆشێ.

٤١ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«لاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
پێشبڕکێ مەکەن (لە ئارەزووی دونیاو هەبوونی زانیاری لەسەر حاڵ و هەواڵی خەڵک)، ئیرەیی بە یەکتر مەبەن، وە ڕق و کینەتان بەرانبەر یەکتر نەبێ و، یەکدی مەبوغزێنن، پشت لە یەکتر مەکەن، ببنە بەندەی خواو برای یەکتربن.

٤٢ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«لاَ يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ پیاوێك خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا (بۆ هەمان کەس) هەتا هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، یاخود وازی لێ دێنێ.

٤٣ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الأَعْمَالِ: الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا، وَبِرُّ الوَالِدَيْنِ»

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
باشترین و گەورەترین کردەوە: نوێژکردن لە کاتی خۆیی و چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکدا.

٤٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: «مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ».

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕەخنەو گلەیی نەگرتووە لە (شێوەو جۆری) خواردن، ئەگەر ئارەزووی کردبا دەیخوارد، ئەگەر ئارەزووی نەکردبا (نەیدەخوارد) وازی لێ دەهێنا.

٤٥ . عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ العَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَابْدَءُوا بِالعَشَاءِ».

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خواردن دانراو، قامەتیش کرا بۆ نوێژ کردن، سەرەتا دەست بکەن بە نان خواردن.

٤٦ . عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ».

**واته:** سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گرەنتی پاراستنی زمانی و داوێنیم بۆ بکات، گرەنتی (چوونە) بەهەشتی بۆ دەکەم.

٤٧ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِأَخِيهِ: يَا كَافِرُ، فَقَدْ بَاءَ بِهِ أَحَدُهُمَا».

**واته:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
ئەگەر پیاوێک بە براکەی گوت: ئەی بێبڕوا (کافر)، ئەوە بە دڵنیایی گوناهی ئەم بێبڕواییە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە.

٤٨ . عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ»

**واته:** عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو نیعمەت هەن زۆربەی خەڵکی لێیان بێئاگان (قەدریان نازانن ئەوانیش:) تەندروستی باش و هەبوونی دەرفەت.

٤٩ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ».

**واته:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

هەر کەسێک لە هەر ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) پاک و بێگەردی و ستایش بۆ خوا، گوناهەکانی هەڵدەوەرن، ئەگەر بە وێنەی کەف و بڵقی دەریاش بن.

٥٠ . عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:

«إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ وَيَثْبُتَ الجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا».

**واته:** ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
بێگومان لە نیشانەکانی کۆتایهاتنی دونیایە: کە زانست هەڵدەگیرێتەوە، نەفامی جێگیر دەبێ، مەی (شەڕابی زۆر) دەخورێتەوە، زیناو داوێنپیسی بڵاودەبێتەوە.

تێبینی:
هەر بەڕێزێك ئەم PDF بەکاردەهێنێت بۆ تاقیکردنەوەکە، پێویستە لە ڕێگەی نامەیەکەوە ناوی خۆی تۆمار بکات، ئەگینا بە بەشداربوو حساب ناکرێت. ( ناوی سیانی و شوێن و ئاستی خوێندن) بنێرە بۆ 07507389118 (ڤایبەر یان وەتس ئاپ)